بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)الروم:٤٧ وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله قائد المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

حوكم نەکردن بە قورئان هەڵە و لادانێکی گەورەیە لە بیروباوەڕدا چەمکی (الحكم بما أنزل الله) یەکێکە لە مەزنترین و گرنگترین چەمکەکانی عەقیدە لە ئیسلامدا و ئەوانەی پشت لە قورئان هەڵدەکەن و حوکم بە شەریعەتەکەی ناکەن الله عزوجل بە ڕاستەوخۆ لە سێ ئایەتدا بە فاسق و بە کافر و بە زاڵم وەسفی کردوون، هەروەها لە دەیان ئایەتی تردا لە قورئان و زۆر لە فەرموودەکانی پێغەمبەردا ﷺ جەخت لەسەر گرنگی ئەو مەسەلە کراوەتەوە لە ئیسلامدا.

(الحكم بما أنزل الله) واتە جێبەجێکرجنی شەرعی الله لە واقیعی ژیانی دونیادا، واتە موسوڵمان لە ژیانی کەسێتی خۆی و لە پەیوەندی

بە غەیری خۆیەوە و لە کاتێکدا بەرپرسیارێتی کەسانێکی تر لە ئەستۆ دەگرێت و لە هەموو کاروبارەکانی ژیانیدا شەرعی الله عزوجل جێبەجێ بکات، واتە حوکم کردن بە شەرع گشتگیرە بۆ تاك و خێزان و بۆ کۆمەڵگا، هەموان دەبێت ملکەچی حوکمەکانی قورئان و سوننەت بن، مادام خۆیان بە موسوڵمان دەزان، ئەوە ماف و واتا و مەرجێکی سەرەکی موسوڵمان بوونیانە کە حوکم بە شەرعی الله بکەن و ڕایین بەرپا بکەن بەو شێوەی کە الله تعالى پێی ڕازییە.

الله عزوجل هەموو پێغەمبەرانی بۆ ئەوە ناردووە خەڵکی حوکم بە بەشەریعەتەکەی بکەن و کاروباری ژیان و دوارۆژیانی پێ بەرێوە ببەن: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ) الحديد: ٢٥. فەرمانی بە پێغەمبەریش کردوە ﷺ کە حوکم بە قورئان بکات وفەرموویەتی: (وَأَنِ احْكُمْ بَيْنَهُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَنْ يَفْتِنُوكَ عَنْ بَعْضِ مَا أَنْزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ) المائدة: ٤٩.

گەڕانەوەشی بۆ شەرعی الله و حوکمی پێغەمبەر ﷺ بە مەرجی ئیمان داناوەو ڕازی بوونی دڵ و ناخی کەسەکەش بە قورئان و سوننەت بە مەرج گیراوە بۆ ئیمانی هەر کەسێك، وەکو فەرموویەتی: (فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا) النساء: ٦٥.

هەروەها الله عزوجل ڕوونی کردووەتەوە کە باوەڕ هێنان بە الله و پێغەمبەرەکەی کۆنابنەوە لەگەڵ حوکم نەکردن بەشەرعەکەی و فەرموویەتی: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا) النساء: ٦٠. بەڵکو ئیمانی هیچ کەسێك ئیمانێکی تەواو وەرگیراو نییە ئەگەر بە تەواوی خۆی بەدەست حوکمەکانی الله عزوجل نەدات: (وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْرًا أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا مُبِينًا) الأحزاب: ٣٦. ناحەزانی ئیسلام لە هەموو سەردەمێکدا هەموو توانا و وزەی خۆیان دەخەنە گەڕ بۆ ئەوەی شەرعی الله کاری پێ نەکرێت و بەرپا نەکرێت، بەداخەوە لەم سەردەمەی خۆماندا لە هەموو سەردەمێکی تر زیاتر توانیویانە ئەو ئامانج و ئاواتەیان بەدی بهێنن و ئەمڕۆ شەرعی الله لە بازنەیەکی تەسك و ناگشتگیردا جێبەجێ دەکرێت و کارەساتیش ئەوەیە کە موسوڵمانان بە زۆری دەسەڵات و بە ڕێگای جۆراوجۆرەوە ناچار کراون و هەندێ جار هەر خۆیان قەناعەتیان بۆ درووست دەبێت کە حوکم بە قورئان و سوننەت نەکەن و لەبەرانبەردا حوکم بە یاسا دەسکردە پڕ لە کەموکورتییەکانی مرۆڤەکان بکەن.

یەهود ونەسارا بەردوام هەوڵ و کۆششیان بۆ ئەوەیە موسوڵمانان حوکم بە قورئان نەکەن وپشتی لێ هەڵبکەن، بەداخەوە موسوڵمانانیش بەهۆی لاوازی لایەن شەرعی و ناحیێگیری عەقیدەیان، هەروەها لەبەر سەرسام بوونیان بە پێشکەوتنی تەکنەلۆجیای ڕۆژئاوا گوێڕایەڵییان دەکەن و متمانەی زۆریان پێیانە و بگرە بەدەر لە بنەمای ولاء و براء ئەوانیان خۆش دەوێت و پێان سەرسامن ولاساییان دەکەنەوە.

الله عزوجل ئێمەی ئاگادار کردووە کە جولەکە و نەسارا بە کەمتر لە شوێنکەوتنی دینەکەیان لە موسوڵمانان ڕازی نابن و فەررموویەتی: (وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ) البقرة: ١٢٠.

بەڵام زۆربەی موسوڵمانان بە هۆێ نەشارەزاییان لە مەنهەجی بیروباوەڕ و تەوحید لە قورئاندا بوونەتە نێچیرێکی ئاسان بۆ نەیارەکانی دینەکەیان و بە شێوازێکی سەرسوڕهێنەر پلانەکانی ئەوان چۆن بیانەوێت بەوشێوە بۆیان جێبەجێ دەکەن. لە ڕاستیدا موسوڵمان نە بەختەوەر دەبێت و نە ڕزق ورۆزی فراوان دەبێت و نە سەرکەوتن بەچاو دەبینێت و نە هەست بە ئاسوودەیی دڵ ودەروومی دەکات و نە دەتوانێت بەندایەتی بەو شێوەی الله داوای لێ دەکات جێبەجێی بکات، بەبێ ئەوەی لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا وهەروەها لە هەموو کاروبارێکی عیبادەت و بانگەواز و پەروەردەیدا نەگەڕێتەوە بۆ شەرعی

الله و کیتاب و سوننەت نەکات بە سەرچاوەی حوکم و بە مەشخەڵی ژیانی خۆی و تلکو هەموو یاسا وڕێسایەکی ناکوك لەگەڵ قورئان وسوننەتدا ڕەت نەکانەوە ئیمان وتەوحیدی تەواو نییە. حەقیقەتێکی حاشا هەڵنەگرە کە تەوحیدی موسوڵمان تەواو نییە و ئیمانی نوقسان و ناپەسەندە تاکو لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا خۆی ڕادەستی شەرع و حوکمی قورئان و سوننەت نەکات وبە حوکمی شەرع ڕازی نەبێت، چونکە مەسەلەی (الحكم بما أنزل الله) بەشێکی جەوهەری و مەزنە لە تەوحیدی (الربوبية) پەروەردگاریێتی، الله فەرموویەتی: (اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا إِلَهًا وَاحِدًا لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ) التوبة/٣١.

الله عزوجل تووڕەیی و قینی خۆی دابەزاندووەتە سەر ئەو کەسانەی کە حوکم بەشەریعەتەکەی ناکەن، لەبەر ئەو هۆیەش بە کافر و زاڵم و فاسق وەسفی کردوون و فەرموویەتی: (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) المائدة/٤٤، (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) المائدة/٤٥، (وَمَنْ لَمْ يَحْكُمْ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ) المائدة/٤٧ .

یەکێك لەو وتە بەناوبانگانەی لە عبدالله بن عباس الله لێی ڕازی بێت دەگێڕدرێتەوەو گەورەترین مشت و مڕی لەسەر درووست بووە و زۆرترین قسەی لەسەر کراوە و ناکۆکیشی لەسەر درووست بووە ئایا وتەیەکی ڕاست و درووستە و سەنەدەکەی صحیح ە، یان نەخێر زنجیرەی سەنەکەی لاوازی تێدایە و ناشێت لەمەسەلەیەکی گەورەی وەکو (الحكم بما أنزل الله) بکرێتە بەڵگە، ئەو وتەیە کە ئەو هاوەڵە بەرێزە لە تەفسیری ئایەتی (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) لێی دگێڕدرێتەوە، کە فەرموویەتی ئەو کوفرە نییە کە کەسەکە لە بازنەی ئیسلام دەربکات بەڵکو ئەوە کوفری بچووکە و بە (کفر دون کفر) دەربڕینی لێ کردووە، ئەمەش لە کاتێکدایە کە الله جل وعلا بە ڕاشکاوی و بە وشە و دەربڕینێکی عەرەبی ڕوون و ڕاشکاو سیفەتی کوفر و زوڵم و فیسقی داوەتە پاڵ ئەو کەسەی کە بە قورئان حوکم نەکات.

پێش ئەوەی لە ڕۆشنایی قسەی فەرموودەناساندا باس لە سەنەدی ئەو وتەیەی ابن عباس بکەین، پێویستە بزانین ئەم هاوەڵە بەڕێزە تەمەنی سیانزە ساڵ بووە کاتێك پێغەمبەر ﷺ وەفاتی کردووە، حوکمڕانەکانی سەردەمی ئەویش بریتی بوونە لە خەلیفە أبو بکر الصدیق وعمر بن الخطاب و عثمان بن عفان و علي بن أبي طالب الله لە هەموویان

ڕازی بێت و تاکو دەگاتە سەردەمی عبد الملك بن مروان کە ابن عباس لەو سەردەمەدا و لە ساڵی ٦٨ی کۆچی وەفاتی کردووە، واتە ئەو سەردەمانەی ئەوی تێدا ژیاوە لە هەموویدا حوکم کردن و خەڵکی و وڵات بەڕێوە بردن هەمووی لەسەر بنەمای کیتاب و سوننەت بووە وشتێك نەبووە هاوشێوەی ئەم سەردەمە کە حوکمی الله بەجارێك لاببرێت و لە جیاتی ئەوەش حوکم بە یاسا و ڕێسای دەستکردی ڕۆژهەوڵات و ڕۆژئاوای پێچەاونەی کیتاب و سونەت بکرێت و نەکەسیش ئەوەی بە خەیاڵدا هاتووە.

سەرەتا با لە ڕۆشنایی قسەی زانایاندا و بە کورتی ئاماژە بۆ سەنەد و ڕێگای جێگیربوونی وتەکەی ابن عباس (کفر دون کفر) بکەین و بڵێین: لە ڕاستیدا ئەم (أثر)ەی ابن عباس الله لێی ڕازی بێت زانایان لە دێر زەمانەوە ناکۆکی لە نێوانیاندا لەسەر سەنەدو جێگیر بوونی درووست بووە و زۆرێك لە زانایان و لەفەرموودەناسان ئەو قەولەیان ڕەت کردووەتەوە و و بە ضعیف یان زانیوە لەبەر ئەم هۆکارانە:

- ئەم فەرموودەیە سەرەتا پێویستە بزانین مەوقوفە و مەرفوع نییە، لەلایەن ابن أبي حاتم والحاكم لە کتێبی المستدرك والبيهقي لە کتێبی السنن و هەروەها المروزي لە کتێبی تعظيم قدر الصلاة وابن

عبدالبر لە التمهيد لە ڕێگەی هشام بن حجير بە گێڕانەوە لە طاووس ئەویش بە گێڕانەوە لە ابن عباس ڕیوایەت کراوە وەکو زانایان دەفەرموون.

ئەمەش نموونەی ڕیوایەت و وتەی الصنعاني یە لەسەر مەسەلەکە: قال الأمام عبد الرزاق الصنعاني في (تفسيره) كما في تفسير ابن كثير(٢/٩٧): أخبرنا معمر عن ابن طاووس عن أبيه قال سئل ابن عباس عن قوله: (ومن لم يحكم... ) قال هي((به كفر) قلت: هذا إسناد صحيح ورواه ابن جرير الطبري في تفسيره(٦/٢٥٦)

وابن نصر في (تعظيم قدر الصلاة) رقم(٥٧٠)كلاهما من طريق عبد الرزاق به وزادا: قال ابن طاووس: (وليس كمن كفر بالله وملائكته وكتبه ورسله).

ئەم وتەیەی ابن عباس لە تەفسیرەی ئایەتەکانی سوڕەتی المائدة دا باس دەکرێت کە الله عزوجل سیفەتی کوفر و زوڵم و فیسقی داوەتە پاڵ هەرکەسێك حوکم بە قورئان وشەریعەتی رب العالمين نەکات، قەولەکەشی ئەوەیە کە فەرموویەتی (كفر دون كفر) واتە ئەو کوفرە نییە کە ئێوە بۆی دەچن بەڵکو کوفری بچووکە و کەسەکە لە بازنەی ئیسلام پێی دەرناچێت، بە دەستەواژەیەکی تر بۆ ئەم سەردەمەی خۆمان واتە ئەوانەی حوکم بە قورئان و بەشەریعەت ناکەن و لەبریدا

حوکم بە قانونی فەرەنسی و ئەمریکی و هەر یاسا و ڕێسایەکی تری مرۆڤەکان دەکەن، ئەگەر لە ناخیاندا باوەڕیان وا نەبێت کە ئەو حوکم و یاسایە لە حوکمی قورئان و لەشەریعەتی ئیسلام باشترە با حوکمیشی پێ بکەن پێی کافر نابن و تەنها تاوانێکەو ئەنجامیان داوە.
لە ڕاستیدا ابن عباس لەوە گەورەتر و تێگەیشتوترە لە عەقیدەی ئیسلام بەرگری لە موسوڵمان بوونی کەسێك بکات کە حوکم بە کتێبی الله نەکات وحوکم بە غەیری شەریعەتی ئیسلام بکات،
بۆیە ئەگەر سەنەدی ئەو قەولە صحیح یش بێت وەکو هەندێ لە زانایان دەڵێن بێگومان مەبەستی ئەم واقیعە تاڵەی ئەم سەردەمەی خۆمان نییە کە شەریعەتی ئیسلام تێیدا لابراوەو گۆڕدراوە بە یاسا و ڕێسا دەستکردەکانی مرۆڤ، بەڵکو ابن عباس لەسەردەمی خەواریج بوو و خەوارجیش موسوڵمانیان بە تاوان تەکفیر دەکرد، بۆیە لە حاڵی جێگیر بوونیدا مەبەستی ئەوانە بووە.
ئەهلی سوننەت و جەماعەتیش ڕاستەو حەقە کە ئەنجامدەری تاوانی گەورە بە کافر نازانن مەگەر ئەو تاوانە بەحەڵاڵ بزانێت واتە استحلالی بکات.

ئەم قەولەی ابن عباس هەموو ڕێگەکانی دەچنەوە سەر (هشام بن حجير) وفەرموودەناسان قسەیان لەسەر ئەو هیشامە کردووە و پێشەوایان أحمد بن حنبل و يحيى بن معين بە ضعيف يان زانيوە و سفيان بن عيينەش دەیوت ئێمە هیچمان لە هیشام وەرنەدەگرت ئەگەر لەلای غەیری ئەو دەستنەکەوتایە و تەنها ئەو ڕێوایەتی بکردایە، لەبەرانبەردا بۆچوونی تریش دەربارەی ئەو هیشامە هەیە.

ئینجا ئەوانەی کەلەم مەسەلەدا قسەیان کردووە وتوویانە ئەو قەولە و بەو شێوەیە (كفر دون كفر) جێگیر نەبووەو ڕاست نییە، بەڵکو ئەوەی جێگیر بووەو سەحیحە ئەوەیە کە المروزی لە تعظيم قدر الصلاة و عبدالرزاق لە المصنف دا ڕیوایەتیان کردووە لە فەرموودەی معمر لە طاوس لە باوکیەوە کە ابن عباس دەربارەی ئایەتی (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) پرسیاری لێ کراوە فەرموویەتی: (هي به كفر) واتە کەسێك بە قورئان حوکم نەکات بەوە کافر دەبێت و وەکو لەو تەحقیقەی عبدالعزيز الطريفي کردوویەتی و بەوە گەیشتووە کە ئەوەیان صحيح ە نەك ئەوەی کە وتبێتی (كفر دون كفر) چونکە لە ڕاستیدا کەسێك بڵێت حوکم نەکردن بە قورئانی پیرۆز کوفر نییە و تەنها تاوانە لە کاتێکدا الله عزوجل لە سێ ئایەت بە دوای یەکدا بە

ڕاشکای و بە صریح ی فەرموویەتی ئەوەی حوکم بە قورئان نەکات کافر ەو زاڵمە و فاسقە، ئەوە دژایەتییە بۆ پەیامی پێغەمبەران علیهم السلام وهەڵوەشانەوەیە بۆ حوکمەکانی قورئان کە الله تەشریعی کردووەو دایبەزاندووە، بەڵکو ڕاست ئەوەیە

- وەکو الشنقیطي دەڵێت - ئەو کەسەی حوکم بە قورئان نەکات و حوکم بەبەرنامەی تر بکات ئەوە کوفر و زوڵم و فیسقێکی گەورەیە نەك بچووك،

لە ڕاستیدا من لێرەدا مەبەستم نییە ئەو مەسەلە لەڕووی سەنەدەوە شیبکەمەوە چونکە ئەوە بۆ خۆی کتێبێکی دەوێت بەڵام مەبەستمە بە کورتی بڵێم زانایان فەرموویانە ئەو قەولە بەو شێوەی کە مەشهورە ڕاست نییە و (شاذ)ە، لەبەر ئەوەی هاوەڵی لە ابن عباس شارەزاتر و نزیکتر لە پێغەمبەر ﷺ وەکو ابن مسعود و عمر بن الخطاب پێچەوانەکەیان ڕیوایەت کردووە، بەڵکو خودی ابن عباس ڕیوایەتی تری لەمە سەحیحتری لێ جێگیر بووە کە بە پێچەوانەوە وتوویەتی کەسێك حوکم بە قورئان نەکات لە ئیسلام دەردچێت، ئینجا لە پیش هەموو ئەوانەشەوە ئایەتەکانی قورئان نەك تەنها ئەوەی کە لە سورەتی

مائدة بەڵکو دەیان ئایەت و فەرمووەی صحیح ئەو حەقیقەتە بەیان دەکەن، هەروەها:

-ئیجماعی هاوەڵان الله لێیان ڕازی بێت لەسەر ئەوەیە کە کەسێك حوکم بە قورئان و شەریعەت نەکات لە ئیسلام دەردەچێت بێ ئەوەی کەسێك لەوەدا ناکۆك بێت.

-ئایەتەکانیش بەچەندەها شێوە جەختیان لەسەر بێ باوەڕی ئەو کەسە کردووەتەوە کە پشت لە قورئان هەڵ بکات و حوکمی پێ نەکات.

ابن عباس الله لێی ڕازی بێت لەم مەسەلەیەدا لەگەڵ کەسانێکدا گفتۆگۆی دەکرد وتیان أبو بکر و عومەر وایان فەرمووە ، ئەویش فەرمووی پێم وایە ئێوە تیابچن! من دەڵێم پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم وای فەرمووە ئێوە دەلێن أبو بکر و عمر؟! کەسێك بەو شێوە قسەی ئەو دوو هاوەڵە ڕەت بکاتەوە کە بە جیاوازی بینیوە لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر دا صلی الله علیه و سلم، چۆن دەگونجێت قەولێکی لێ بگێڕدرێتەوە بۆ شەرعییەتدان بە حوکم نەکردن بە یاساو ڕێسای غەیری قورئان و بچووك کردنەوەی ئەو کارەساتە بە وەسفکردنی وەکو تاوانێکی ئاسایی: پیشەوا أحمد (٣١٢١) لە ابْنِ عَبَّاسٍ دەگێڕێتەوە، فەموویەتی: "تَمَتَّعَ النَّبِيُّ ﷺ، فَقَالَ عُرْوَةُ بْنُ الزُّبَيْرِ: نَهَى أَبُو بَكْرٍ

وَعُمَرُ عَنِ الْمُتْعَةِ ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: مَا يَقُولُ عُرَيَّةُ؟ قَالَ: يَقُولُ: نَهَى أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ عَنِ الْمُتْعَةِ ، فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: أُرَاهُمْ سَيَهْلِكُونَ أَقُولُ: قَالَ النَّبِيُّ ﷺ، وَيَقُولُ: نَهَى أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ؟ " کورتەی ئەو پەیامەش کە ئەم ڕیوایەتە هەڵیدەگرێت ئەوەیە ابن عباس ئیمانی وا بووە دەبێت موسوڵمان ملکەچی تەواوی هەبێت بۆ قورئان و بۆ سوننەتی پێغەمبەر ﷺ هەموو قەولێکی پێچەوانەی ئەو دوو سەرچاوە ڕەتبکرێتەوە و کاری پی نەکرێت ئەگەر قەولی أبو بکر و عمر یش بووە الله لێیان ڕازی بێت.

ئینجا ئەگەر ڕیوایەتەکە بەو شێوەش کە باس کراوە و جیگیریش بوایە پرسیارێکی گرنگ دەمێنیت پێویستە لە خۆمانی بکەین: کەی قەولی هاوەڵ دەبێتە بەڵگە و واجبە کاری پێ بکرێت؟ زانایان دەفەرموون کاتێك قەولی صحابی دەبێتە حوججە و کاری پێ دەکرێت ئەم مەرجانەی تێدا بێت:

- ئەگەر حوکمی ڕەفع وەربگرێت واتە ئەسڵی وتەکە بگەڕێتەوە بۆ حوکم و ڕێگەپێدانی پێغەمبەر ﷺ بۆ نموونە هاوەڵەکە بفەرموێت: (أمرنا بکذا أو نهینا عن کذا أو من السنة کذا أو کنا نقول کذا...) واتە فەرمانمان پێدەکرا فلانە شت بکەین یان نەیکەین یان سوننەت وایە وابکرێت یان وامان دەوت و دەکرد ...هتد چونکە سەرچاوەی ئەو

فەرمان و قەدەغە کردن و ئەنجامدان و نەدانە پێغەمبەر ﷺ خۆی بووە بۆیە قەولی هاوەڵ لەو حاڵەتانەدا حوکمی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ وەردەگرێت.

- ئەگەر قەولی هاوەڵەکە پێچەوانەی زاهیری قورئان نەبێت، ئەم قەولەی ابن عباس یش لە ڕاستیدا زۆر بە ڕاشکاوی پێچەوانەی زاهیری قورئانە، چونکە الله فەرموویەتی: (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ )المائدة: ٤٤-٤٧. چۆن ابن عباس بەو مەزنی و زانایی و گەورەیی خۆیەوە دێت ئەو ئایەتانە ڕەت دەکاتەوە و دەڵێت نەخێر الله مەبەستی ئەوە نەبووە ئێوە خراپ لە ئایەتەکە تێگەیشتوون! حوکم نەکردن بە قورئان سەرەڕای ئەو هەموو ئایەتانەی کە بە ڕاشکاوی سیفەتی کوفر بەسەر ئەو کەسەدا دەدات و حوکم بە قورئان ناکات، پووچەڵ کردنەوەیە بۆ عەقیدەی ئیسلامی و پێچەوانەی پەیامی پێغەمبەرانە کە الله بۆ ئەو مەبەستە ڕەوانەی کردوون.

-هەروەها مەرجێکی تر بۆ وەرگرتنی قەولی هاوەڵ ئەوەیە ئەگەر موعارەزەی نەبێت لە قەولی هاوڵی تر کە لە خۆی زیاتر هاوەڵێتی پێغەمبەری کردبێت ﷺ، لە ڕاستیشدا ئەم قەولەی ابن عباس الله لێی

ڕازی بێت موعارەزەی ڕوون و ئاشکرای هەیە لە چەند هاوەڵێك لە خۆی زیاتر هاوەڵێتی پێغەمبەریان کردووە ﷺ وەکو عمر بن الخطاب و عبدالله بن مسعود الله لێیان ڕازی بێت، بەڵکو موعارەزەی لە قەولی ابن عباس خۆیشی هەیە لە جێگەی تردا، بەڵکو نەزانراوە ك هیچ هاوەڵێك قسەی لەو جۆرە کردبێت.

لە ڕاستیدا:

١- تحاكم کردن بۆ غەیری شەرعی الله هەموو موسوڵمانێکی سەرەتایی فیترەت پاك دەیزانێت و گومانی لێی نییە، ئیتر چۆن قسەیەکی وا گەورە و ناکۆك لە گەڵ زاهیری قورئان دەدرێتە پال زانای هەرەگەورەی ناو هاوەڵان و (حبر الأمة).

٢- گومانی تێدا نییە لە حاڵی جێگیر بوونی سەنەدی ئەم قەولەش، مەبەستی پێی هەندێ لە کاربەدەستانی بەنی ئومەییە بووە، یان مەبەستی خەواریجەکان بووە کە موسوڵمانیان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە تەکفیر دەکرد، چونکە ئەوان بە بەڵگەی ئایەتەکانی سوڕەتی المائدة ئەنجامدەری کەبیرەیان بە کافر دەزانی و ابن عباس یش ئەوەی بۆ ڕوون کردنەوە کە وا نییە موسوڵمان بە ئەنجامدانی تاوانی گەورە کافر نابێت مەگەر ئەنجامدانەکەی بە حەڵاڵ درووست بزانێت.

٣- ئەمەی کە ئەمڕۆ زانایانی سوڵتانەکان بەرگری لێ دەکەن و بەناحەق ئەو قەولەی ابن عباس ی بۆ دەهێننەوە کە گوایە گۆڕینی حوکمی قورئان بە یاساکانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەڵاتی پێچەوانەی قورئان کوفر نییە و تاوانێکە، ئەو حاڵەتە هەرگیز لەسەردەمی ابن عباس لە دونیادا بوونی نەبووە، بەڵکو یەکەم جار لەسەردەمی ابن تيميةدا درووست بوو دوای سەدان ساڵ لە سەردەمی هاوەڵان کاتێك جەنکیزخان ئاوێتەیەکی لە ئیسلام و لە یەهودییەت و نەسڕانیەت کۆکردەوەو حوکمی پێ دەکرد.

٤- ئەوانەی کە قەولەکەی ابن عباس دەکەن بە بەهانە و شەرعاندنی حوکم نەکردن بە قورئان لە ڕاستیدا ئەوان تۆمەتی تەبدیل کردنی شەرعی ئیسلام بە شەرع و یاسا و ڕێسای تر دەدەنە پاڵ ئەو هاوەڵە مەزنە، وەکو ئەوەی (حبر الأمة) نەیزانیبێت الله تعالى فەرموویەتی: (وإن أطعتموهم إنكم لمشركون) و (فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ) و(فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ) و دەیان و سەدان ئایەتی تری نەزانیبێت، یان وەکو ئەوان مەعناکانی تێکدابێت و بە ئارەزووی خۆی و بۆ ڕازی کردنی زالمان خۆی لە مەعناکانیان کەڕ کردبێت حاشا لەئەو.

٥- ئەو قەولەی دەدرێتە پاڵ ابن عباس (كفر دون كفر) ئەوە ئەگەر بەو شێوە وەكو خۆی وەربگیرێت دەبێت بەهۆیەوە زاهیری ئایەتەكان ڕەتبكرێتەوە و بڵێین الله مەبەستی ئەوە نەبووە و بە قەولێكی زەعیف بەشێكی زۆر لە قورئان و سوننەت و عەقیدەی ئیسلامی لەبەر ئەو قەولە ڕەت بكرێتەوە.

٦- مەسەلەی عەقیدە لە ئیسلامدا منجە منج و سازش و ناڕوونی تێدا نییە، بەڵكو لە ئەوپەڕی ڕوونی و جیددیەت و حەددیەتدایە، ئەوانەی باوەڕیان بە قورئان و سوننەتە و حوكمی پێ دەكەن و هەموو بەرنامە و یاسا و ڕێسایەك جگە لە قورئان ڕەتدەكەنەوە موسوڵمانن و ئیماندارن و عەقیدەو تەوحیدیان تەواوە، ئەوانەش كە حوكم بە قورئان و بەشەریعەتی ئیسلام ناكەن و بە حوكم و ئایەتی قورئانی پیرۆز كافر و زاڵم و فاسقن.

٧- ئایەتەکانی قورئان لە هەموو باسێکدا لە بواری عەقیدە بێت یان شەریعەت، گەلێك ڕوونن و هەموو کەسێك بە ئاسانی لێی تێدەگات و دەتوانێت حوکمەکەی لێ وەربگرێت، تۆی خوێنەر وەرە بەدەر لەوەی فلان زانا و فیسار شەرعزان چی وتووە، وەرە قەولەکەی ابن عباس و دەیان ئایەتی قورئان بخوینەوە وبەراوردیان بکە، بۆ نموونە: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ) بزانە هەست بە جیاوازی و دژواری ناکەیت لە نێوانیاندا؟!

٨- حوکم کردن بە شەریعەتی الله عزوجل مەنهەج و ڕێبازی هەموو پێغەمبەرانە علیهم السلام، الله بەوە فەرمانی پێ کردوون و فەرموویەتی: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ) المائدة:٤٨.

حوکم نەکرنیش بە شەریعەتەکەی پوچەڵکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەی کرۆك و جەوهەری تەوحید و یەك الله پەرستییە، الله لە ئایەتەکاندا فەرمانی بە پیغەمبەر ﷺ کردووە حوکم بە قورئان بکات و پشت هەڵ بکات لە هەموو حوکم و ئارەزوو و یاسای مرۆڤەکان، چونکە ئەو حەقەی کە پێیەتی بێ نیازی کردووە لە هەموو بەرنامە و یاسا و ڕێسایەکی تری دەستکردی مرۆڤەکان.

٩- مورجیئەکان لە هەموو سەردەمێکدا پیاوی سوڵتانن و دەقەکانیان بۆ دەگونجێنن بەو شێوەی ئەوان حەزی پێ دەکەن و دەیانەوێت، بۆیە لەم سەردەمەشدا بەدەست و بەدان ئەو قەولە زەعیفەی ابن عباس یان گرتووە و دەستبەرداری نابن! دەیان ئایەتی صریح و ڕوون و ئاشکرایان لەبەر ئەو قەولە تەئویل کردووە و ڕوویان لێ وەرگێڕاوە کە پێچەوانەی ئەو قەولەی ابن عباس ە، هەمیشە پاساو بۆ ئەوانە دەهێننەوە کە حوکم بە قورئان ناکەن بەوەی کە ئەوە تاوانێکە و بەوە لە ئیسلام دەرناچن، هەرکێیش حەقیقەتی ئەو مەسەلە دەربخات و یان حەقیقەتی ڕۆڵی ئەوان لەم بارەوە ئاشکرا بکات یەکسەر بەخەواریج تۆمەت باری دەکەن.

١٠- بەڵکو ئەوانەی کە بەرگری لەو کەسانە دەکەن کە شەرعی الله یان گۆڕیوەو کار بەشەرع و بەرنامەی تر دەکەن و دەڵێن کوفرەکەیان بچووکە وئەوانە موسوڵمانن، لە ڕاستیدا ئەوان ئایەتەکانی قورئانیان ڕەتکردووەتەوەو تێبینیان لەسەر واتاکانی تۆمار کردووە و لە پێناو قەولێکی زەعیفدا کە ئەگەر سەحیحیش بوایە هەر وەرنەدەگیرا، دەیان و سەدان ئایەتیان تەئویل کردووە و خۆیانیان لێ نابینا کردووە، ئەوەش پێچەوانەی شەرع و عەقڵ و بنەما سەرەتایەکانی عەقیدەی ئیسلامە.

١١- هەندێ لەو زانا بەڕێزانەش کە ئەو قەولەی ابن عباس بە صحیح دەزانن وەکو مورجیئەکان نەیان کردووە بە بەهانەی تێکدانی عەقیدە و خزمەتی ستەمکاران و کارنەکردن بە شەریعەتی ئیسلام، پرسیار لە شێخ ابن باز کرا دەربارەی قەولەکەی ابن عباس فەرمووی ئەوە بۆ حاڵەتێکە بۆ نموونە حاکمەکە باوەڕی تەواوی بەشەریعەتی ئیسلام هەبێت بۆ نموونە بەرتیلێك وەربگرێت وبیشەرعێنێت بۆ خۆی و حوکم بە حەرامی بەرتیل نەکات و شتێکی لەو جۆرە ئەوە پێی دەوترێت کفر دون کفر نەك بچێت شەرعی ئیسلام لابدات و بە شەریعەتی بێ باوەڕان کار بکات.

١٢- ابن کثیر رحمە اللە فەرموویەتی : " فمن ترك الشرع المحكم المنزل علی محمد بن عبد الله خاتم الأنبياء ، وتحاكم إلى غيره من الشرائع المنسوخة كفر، فكيف بمن تحاكم إلى الياسا وقدمها عليه ؟! من فعل ذلك كفر بإجماع المسلمين " "البداية والنهاية" (١٣/١٣٩).

واتە هەرکەسێك شەرعی اللە بەجێ بهێڵێت و حوکم بە شەریعەتە مەنسوخەکان بکات کافر دەبێت، چجای کەسێك حوکم بە یاسق بکات ولەسەر شەرع پێشی بخات و ئەوە بە ئیجماعی موسوڵمانان لە ئیسلام دەدرەچێت.

١٣- أحمد شاكر بەڕەحمەت بێت لە عمدة التفسير(٤/ ١٥٦-١٥٨)دا دەڵێت گومڕاکان وهەندێ لەوانەی خۆیان بەزانستدا هەڵواسیوە جورئەت بەرانبەر دین دەکەن و ئەو قەولەی ابن عباس یان کردووەتە بەهانەی کارکردن بە یاسا و ڕێسا دژوارەکان لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا.

١٤- قەولەکەی ابن عباس تەنانەت ئەگەر صحيح یش بوایە هەر دەبێت لە چوار چێوەی ئەو سەردەمەی کە تێیدا وتراوە و لە ژێر بنەما گشتییەکانی بیروباوەڕی ئیسلامدا لێی تێبگەین، نەك بکرێتە بەهانە بۆ لابردنی بەشێکی مەزن لە عەقیدەی ئیسلامی، کە ئەویش (الحكم بما أنزا الله) یە. ابن عبا س یش یان مەبەستی بەو قەولە خەواریجەکان بووە یان هەندێ لە حوکمڕانەکانی بەنی ئومەییە بووە کە هەندێ سەرپێچی و لادانیان لەشەرع بووە و مەبەستی ئەوە بووە ئەوان بەو سەرپێچی و کارنەکردنەیان بەو ئایەت و فەرموودانە لە هەندێ مەسەلەدا کافر نابن.

١٥- مەسەلەی حەڵاڵ کردن و حەرام کردن و تەشریع دانان لە تایبەتمەندییەکانی پەروەردگارە، هەرکەسێکیش ئەو تایبەتمەندییە بۆ خۆی بەکاربهێنێت و تەشریع بکات ئەوە بە ئایەت و فەرموودەی و اتفاق ی زانایان موشریکە. (أَلَا لَهُ الْخَلْقُ وَالْأَمْرُ ۗ تَبَارَكَ اللَّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ) الأعراف:٥٤. ئیتر چۆن پێی دەوترێت (کفر دون کفر)؟

١٦- ئینجا تۆ بڵێ ئەوە ابن عباس لەبەر ئەوەی دواجار مرۆڤێکە و معصوم نییە و هەڵەی لەسەر تێدەپەڕێت، بڵێ ئەو هەڵەیەی کرد و وتی ئەو کەسەی حوکم بە قورئان نەکات و حوکم بە شەریعەتێکی تر بکات لە ئیسلام دەرناچێت تەنها تاوانبار دەبێت، کە حاشا لە ئەو هەڵەی لەو شێوە بکات، بەڵام ئەگەر هەڵەیەکی وای کرد ئایا دەگونجێت نیوەی دینەکەمان لەبەر قسەی ابن عباس بڕوخێنین و ئەو هەموو ئایەت و فەرموودە و ئیجماعی هاوەڵان و قسەی زانایان و هەمووی بۆ قەولێکی ابن عباس وەلا بنەین و ئیشی پێ نەکەین؟ مالكم كيف تحكمون؟

ئەم باسە وەکو پێشتریش ئاماژەم بۆ کرد شیکردنەوەی زۆر زیاتر هەڵدەگرێت، بەڵام من ئەمەندەم بە پێویست زانی باسی بکەم، بۆ خستنەڕووی ئەم بەشە بۆ چەندین سەرچاوەی متمانە پێکراو گەڕاومەتەوە و سوودم لە قسەی زانایان وەرگرتووە.

فنسأل الله عز وجل أن يعجل فرج هذه الأمة اللهم أقم علم الجهاد واقمع أهل الزيغ والفساد وانشر رحمتك على العباد. يا من له الدنيا والآخرة وإليه المعاد وصلى الله وسلم وبارك على عبده ورسوله نبينا محمد وعلى آله وأصحابه أجمعين.